# چۆنیەتی حەج کردن

## بەپێی قورئان و سوننەت

نوسینی

أحمد ملا فائق سعيد

١٤٣٣ کۆچی

چاپی یەکەم

# چۆنیەتی حەج کردن

## بەپێی قورئان وسوننەت

نوسینی

أحمد ملا فائق سعید

چاپی یەکەم

١٤٣٣ کۆچی

**ناوی کتێب:** چۆنێتی حەج کردن بەپێی قورئان و سوننەت

**نوسینی:** أحمد ملا فائق سعید

**شوێنی چاپ:**

**ژمارەی سپاردن:** ١١٩٧ ساڵی ٢٠١٢

**لاپەڕە:** ٩٠ لاپەڕە ١٢ X ١٧ سم.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمد لله والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

حەج پێنجەم ڕوکنی ئیسلامە و هۆکاری پاك بوونەوەی ئادەمیزادە لـە هەموو هەڵەکانی ڕابردووی، وە بە کۆبوونەوەی سەرتاسەری جیهانی ئیسلامی ناودەبرێت، (عبادة)و پەرستنێکی ساڵانەیە بە جەستەو ماڵ ئەنجام دەدرێت، زیندوو کردنەوەی کاری پێغەمبەرانە عليهم الصلاة والسلام، سەلماندنی بەندایەتی و بچوکی یە، فڕێدانی بەرگی تاوان و خۆ بەگەورە زانین و لـوت بەرزییە، تازەکردنەوەی پەیمانی خوایە.

بە ئەنجام دانی حەج بەشێوەی خۆی، زۆرێك لـە نهێنی پەروەردە دەروونییەکان و حیکمەت لـە یاساکانی پەروەردگار تێدەگەیت.

بۆ ئەم مەبەستە پێویستی یەکی زۆر گرنگە ئەو حەجە لـەشوێنی خۆی دا بەشێوەی خۆی بە بەڵگە قورئانی و فەرموودە (صحيح)ەکان

ئاشنا بین، تاوەکو وەکو داواکاری یەکی شەرعی دروست ئەنجامی بدەین.

ئەم نوسراوە هەوڵێکە بەو شێوازە خراوەتە بەردەستی حاجییان بە هیوای سودمەندی و بەدیهێنانی حەجێکی وەرگیراو و کارو هوڵێکی پاداشت دراوو لێخۆش بوونی تاوانەکان و قبوڵ بوونی نزاو پاڕانەوەکانیان بە ویستی پەروەردگاری هەموان.

(حَجٌ مَبْرُر وَسَعيٌ مَشْكُور وَذَنْبٌ مَغْفُور)

✍

أحمد ملا فائق

٥ / ٥ / ٢٠١٢ م

# پلەو پایەی حەج

١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَ رَسُوُلَ الله ﷺ قَال: «... الْحَجُ الْمَبْرُورْ لَيْسَ لَهُ جَزَاءً إلاَ الجَنَةْ». البخاري (١٧٧٣)، ومسلم (١٣٤٩).

واتە: حەجێکی وەرگیراو هیچ شتێك شایستەی پاداشتی نیە بێجگە لە بەهەشت.

٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ سُئِلَ رَسُوُلَ الله ﷺ أَيُ العَمَلِ أَفْضَلْ؟ فَقَال: «...حَجٌ مَبْرُوُر». البخاري (٢٦)، ومسلم (٨٣).

واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ چ کارێك پلەوپایەی بەرزە؟ فەرمووی (حەجێکی وەرگیراو).

٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَال: سَمِعْتُ رَسُولَ الله ﷺ يَقُول: «مَنْ حَجَ لله فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمهُ». البخاري (١٥٢١)، ومسلم (١٣٥٠).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەسێك حەج بکات بە مەرجێك هیچ هەڵەو تاوانێکی تیادا ئەنجام نەدات، گەڕانەوەی لەو حەجە وەکو ئەو ڕۆژە وایە کە لەدایك بووە.

٤. عَنْ إبْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قال: سَمِعْتُ رَسُولَ الله ﷺ يَقُولُ: ((مَا تَرْفَع إبل الْحَاج رَجْلاً وَلا تضعُ يَداً إلا كَتَبَ الله لَهُ بِهَا حَسَنَةَ أَو رَفَعَهُ بهَا دَرَجَةً)). صحيح الترغيب (١١٠٦).

واتە: عبداللە ی کوڕی عمر رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەفەرموێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حوشتری هەر حاجییەك قاچ هەڵنابڕێت و وە دەست دانانێت، خوای پەروەردگار چاکەیەکی بۆ دەنوسێت یا تاوانێکی پێ لادەبات یا پلەیەك بەرزی دەکاتەوە.

٥. عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ، قُلْتُ: ((يَا رَسُولَ الله ﷺ أَلاَ نَغزُو وَنُجَاهِدُ مَعَكُمْ؟ فَقَالَ: لَكنْ أَحْسَنَ الْجِهادُ وأَجْمَلهُ: الحَجُ مَبْرورُ)). البخاري (١٨٦١).

واتە: عائشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا جیهادو بەشداری شەڕتان لەگەڵ نەکەین؟ فەرمووی: بەڵام باشترین و جوانترین جیهادتان هەیە: حەجێکی وەرگیراو.

٦. عَنْ عَمْرو بنُ العَاصِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَال: قَالَ رسولُ الله ﷺ: ((... أَمَا عَلِمْتُ أَنَ الإِسْلامَ يَهْدِمُ مَاكَانَ قَبْلهُ... وأَنَ الحَجَ يَهْدِمُ مَاكانَ قَبْلهُ)). البخاري (١٢١).

واتە: ئەی نازانیت ئیسلام بوونت پێشوی خۆی دەسڕێتەوە و حەجیش پێشی خۆی دەسڕێتەوە.

٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَال: قَال رَسُولَ الله ﷺ: «مَنْ خَرَجَ حَاجاً فَمَاتَ كَتَبَ لهُ أجْر الحاج إلى يَوْم القِيامَة». صحيح الترغيب (١١١٤).

واتە: هەرکەسێك بڕوات بۆ حەج و بمرێت لە ڕێگا، پاداشتی حەجی بۆ دەنوسرێت تاوەکو ڕۆژی دوایی، واتە وەکو ئەوە وایە هەر لە حەج دا بێت تا ڕۆژی زیندووبونەوەی.

٨. عَنْ إبْنُ عَبَاس ﵄ قَال: قَال رَسُول الله ﷺ: «مَنْ أَرادَ الحَجَ فَالَيَتَعَجَلْ فَإنَهُ قَدْ يَمْرَضُ الْمَريضَ وتَضلُّ الضَالة وتعرُضُ الحَاجَة». صحيح سنن إبن ماجة (٢٣٣١).

واتە: ئەوەی دەیەوێت بچێت بۆ حەج با پەلە بکات ڕەنگە نەخۆشی بێتە ڕێی و یا وون بوونی ماڵەکەی یا پێویستیەکانی ژیان بێتە ڕێی و نەتوانێت حەجەکە ئەنجام بدات.

وە زیاد لەمانە ئەو پلەو پایانە دەگرێتەوە کە لە پلەو پایەی (عومرە) دا باسمان کردووە: سڕینەوەی لە تاوانەکانی وەك پاککردنەوەی زێڕو زیو، وە نوێنەرن بۆلای خودا، وە جیهادی هەموو لاوازێکە... .

# ناوی ڕۆژەکانی حەج

١. ڕۆژی یەکەم (٨ ذو الحجة) یوم التروية: واتە ڕۆژی تێرئاوکردن، مەبەستیان لە ئاودانی ئاژەڵەکانیان بەتایبەت حوشتر بوە بۆ ئەوەی ئاوێکی زۆر بخوات تا بتوانێت ڕێگای عەرەفەو موزدەلیفە ببڕێت لەبەر بێ ئاوی ئەو ناوچانە.

٢. ڕۆژی دووەم (٩ ذو الحجة) یوم عرفة: ڕۆژی عەرەفە کە حاجییەکان دەمێننەوە لەسەر شاخی عەرەفە.

٣. ڕۆژی سێیەم (١٠ ذو الحجة) یوم النحر: ڕۆژی قوربانی، کە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە حاجییەکان قوربانی دەکەن.

٤. ڕۆژی چوارەم (١١ ذو الحجة) یوم القَرُ: ڕۆژی مانەوە، مەبەست لە مانەوەی حاجییانە لە مینا دا.

٥. ڕۆژی پێنجەم (١٢ ذو الحجة) یوم النفرُ الأول: ڕۆژی دەرچوونی یەکەم، مەبەست لەوەیە حاجی دەتوانێت (مینا) بەجێ بهێڵێت و بگەڕێتەوە مەککە.

٦. ڕۆژی شەشەم (١٣ ذو الحجة) يوم النفرُ الثاني: ڕۆژی دەرچوونی دووەم، مەبەست لە تەواوبوونی مەراسیمی حەجە کە (مینا) بەجێ دەهێڵن.

# کارەکانی حەج

## أ. ڕوکنەکانی حەج:

١. نییەتی ئیحرام: واتە نییەتی چوونە ناو حەجەوە، نەك لەبەرکردنی ئیحرام.

٢. وەستان لە عەرەفە.

٣. تەوافی (الإفاضة) لەدوای وەستانی عەرەفەو مانەوەی موزدەلیفە.

٤. سەعی نێوان سەفاو مەروە.

بەبێ ئەنجام دانی ئەمانە حەجەکە هەڵدەوەشێتەوە.

## ب. مەرجەکانی حەج:

١. لەبەرکردنی جل و بەرگی ئیحرام لە میقاتەوە.

٢. مانەوە لە عەرەفە تاوەکو خۆرئاوابوون.

٣. مانەوەی شەو لە (مزدلفة) بێجگە لە خاوەن ڕوخسەت.
٤. مانەوەی شەو لە (مینا).
٥. تێگرتنی بەردەکانی جەمەرات.
٦. سەرتاشین یاخود کورت کردنەوە.
٧. تەوافی وەداع بۆ کەسێك دەرچێت لە مەککە.

## سوننەتەکانی حەج

١. ڕۆشتن بۆ مینا و مانەوەی شەو (٨ ذو الحجة).
٢. مانەوەی چوارەم ڕۆژی جەژنی قوربان لە مینا.
٣. خۆشۆردن پێش ئیحرام پۆشین.
٤. (تلبية) بە دەنگی بەرز.
٥. ڕەنگی سپی بۆ ئیحرام.

وە پاشماوەو چۆنێتی کارەکانی تری ناو هەموو بەشەکانی مەراسیمی حەج.

# جۆرەکانی حەج

**١. التمتع :**

ئەو حەجەیە کە عومرەو حەج لە مانگەکانی حەج دا ئەنجام دەدەن، وە لە میقات دا دەڵێن (لبيك اللهم بعمرة) یان (بالعمرة مع الحج متمتعاً) پاشان دەچنە مەککەو کارەکانی عومرە ئەنجام دەدەن، دوای ئەوە ئیحرام لەخۆیان دەکەنەوە تا ڕۆژی حەج کردن، پاشان ئیحرام لەبەر دەکەنەوە بۆ حەج، وە لە کۆتایی دا واجبە لەسەری سەربڕینی ئاژەڵ.

**٢. القِران :**

ئەو حەجەیە کە حەج و عومرە بەیەکەوە گرێ دەدات وە لە میقاتەوە دەڵێت (لبيك اللهم بحج و عمرة)، لەپاش عومرە کردنەکەی ئیحرام لانابات و پێوەی دەمێنێتەوە تاوەکو حەجەکەی کۆتایی دێت، وە ئەمیش واجبە لەسەری سەربڕینی ئاژەڵ.

**٣. الإفراد :**

حەجی تەنیا لە میقات دا دەڵێت (لبيك اللهم بحج)، ئیحرام دەپۆشێت تاوەکو کۆتا کارەکانی حەج، بەڵام واجب نییە لەسەری سەربڕینی ئاژەڵ.

## باشترین جۆرەکانی حەج

باشترین جۆرەکانی حەج حەجی (التمتع) ە بۆ کەسێك بە یەك سەفەر عومرەو حەج ئەنجام بدات و ئاژەڵی لەگەڵ خۆی نەبردبێت بۆ سەربڕین لە میقاتەوە، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ : «خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلاَ نُرَى إِلَّا أَنَّهُ الحَجُّ، فَلَمَّا قَدِمْنَا تَطَوَّفْنَا بِالْبَيْتِ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الهَدْيَ أَنْ يَحِلَّ، فَحَلَّ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الهَدْيَ، وَنِسَاؤُهُ لَمْ يَسُقْنَ فَأَحْلَلْنَ». البخاري (١٥٦١)، ومسلم (١٢١١).

واتە: عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بوین ﷺ هەموومان خۆمان ئامادەکردبوو بۆ حەج کردن، کاتێك گەیشتینە مەککەو تەوافمان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی

دا ئەوەی ئاژەڵی لەگەڵ خۆی نەهێناوە بۆ سەربڕین لە میقاتەوە با ئیحرامەكەی لەخۆی بكاتەوە (پاش ئەنجام دانی كارەكانی عومرە)، ئەوەی ئاژەڵی نەهێنابوو ئیحرامەكەیان لەخۆ كردەوە، وە خێزانەكانی پێغەمبەریش ﷺ نەیان هێنابوو ئیحرامەكەیان شكاند.

لەم سەفەرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ و چەند كەسێكی كەم ئاژەڵیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو بۆ سەربڕین وەكو: (أبوبكر، عمر، طلحة، زبير) رضي الله عنهم «وكانَ الهَدي مَعَ رَسُول الله صَلَى الله عَلَيْهِ وَسَلَمْ وَأبُوبَكر وَعُمَر» البخاري (١٥٦١).، «فَكَانَ طَلْحَة بن عُبَيْدَالله فيمَنْ سَاقَ الهَدي فَلَمْ يَحل» مسلم (١٢٣٩).، «وَكَانَ مَعَ الزُبَيْر هَدي فَلَمْ يحلل» مسلم (١٢٣٦).،ئەمان بە ئیحرامەوە مانەوە تا حەجەكەیان تەواو كرد.

٢. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ، قَال رَسُول الله ﷺ: «...وَلَوْ أَني اسْتَقْبَلت منْ أَمْري مَا اسْتَدْبَرْت، مَا سَقَت الهَدي مَعي حَتَى اشْتَرَيْه، ثُمَ أحل كَما حَلوا». مسلم (٢٩٢٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گەر ئەم كارەم پێش بین بوایە پشتم لێ هەڵنەدەكرد ئاژەڵم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، لێرە دەمكرد وئیحرامم لەخۆم دەكردەوە وەكو ئەوان.

وە هۆکاری پێ داگری پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەم کارە (حج التمتع) دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی عبداللە ی کوڕی عباس دەفەرموێت: «کانوا یرون أن العَمْرَة في أشْهَر الحَجِ مِنْ أفجر الفجور في الأَرْض... ». البخاري (١٥٦٤).

واتە: لەپێش ئیسلام دا خەڵکی وا گومانیان دەبرد کە عومرە کردن لە مانگەکانی حەج دا گەورەترین تاوانە لەسەر زەوی، پێغەمبەری خواش ﷺ ویستی ئەم بۆچونەی موشریکەکان هەڵ بوەشێنێتەوە، بۆیە بڕیاری دا بە کردنی عومرە لەگەڵ حەج دا.

## ڕۆژانی حەج

ئەو ڕۆژانەی کارەکانی حەجیان تیا ئەنجام دەدرێت شەش ڕۆژە بەم شێوانەی خوارەوە:

**١. ڕۆژی (٨ ذو الحجة):**

دەبێت حاجی لەو شوێنەی نیشتەجێ یە بەیانی (٨ ذو الحجة) کاتی چێشتەنگاو خۆی بشوات و پێویستییەکانی نینۆك و موو لێکردنەوە ئەنجام بدات، پاشان ئیحرام بپۆشێت.

هەروەك لـە باسی عومرەکەدا باسمان کردووە نابێت ئیحرام پۆش هیچ بەرگێکی ناوەوە و دەرەوە بەخۆیەوە بهێڵێت بێجگە لـە دووبەرگی ئیحرام.

پیاوان دەبێت سەریان ڕووت بێت وە گۆرەوی و دەسکێش بەکارنەهێنن لـەگەڵ دوورکەوتنەوە لـە بۆنی خۆش و نزیك بوونەوەیان لـە خێزان دا.

ئافرەتان بۆیان هەیە بەهەر بەرگ و ڕەنگێك بێت بەکاری بێنن بێجگە لـە دەمووچاو هەڵپێچاندن و دەسکێش نەبێت.

ئەو ئافرەتانەی لـە وادەی سوڕی مانگانەدان دەبێت هەموو کارەکانی حەج ئەنجام بدەن بێجگە لـە تەوافی کەعبەو سەعی نێوان سەفاو مەروە، پێویستە لـەم ڕۆژەدا خۆیان بشۆن و ئیحرام بپۆشن و بچنە ناو کارەکانی حەجەوە وەکو پیاوان هەموو کارێك ئەنجام بدەن.

پاش پۆشینی بەرگی ئیحرام دەتوانن سوننەتی چێشتەنگاو بکەن یاخود سوننەتی دەستنوێژ.

دوای ئەمانە هەرلـە شوێنەكەی خۆی دا ڕوو بكاتە قیبلـەو تەلـبیەی حەج بكات (لبيك اللهم بالحج) خوای پەروەردگار ئامادەم حەج بۆ تۆ بكەم.

● وە دەتوانێت بە مەرج بیگرێت لـە كاتی مەترسی نەتوانینی تەواوكردنی حەجەكە وەك لـە عومرەدا باسمان كردووە.

● لێرەوە واجبە حاجی دەست بكات بە ووتنی تەلـبیە (لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك والملك، لاشريك لك).

وە لـە چێشتەنگاو دا بەرەو (مینا) بكەوێتە ڕێ و نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا و بەیانی بە (قصر) كورت كردنەوە لـە مزگەوتی (خیف) ئەنجامی بدات بەبێ (جمع) كۆكردنەوەیان.

ئەم مانەوەو نوێژەی ڕۆژی (٨ ذو الحجة) و شەو مانەوەی سوننەتەو حەجەكەی پێ كامل دەبێت، وەشوێن كەوتەی پێغەمبەر ﷺ دەبێت، بێگومان بەبێ حیكمەت و سودمەندی حەج نەیكردووە:

١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ ، قَال النبي ﷺ لها لَمَا حَاضَتْ: ((...فَافْعَلِي مَا يَفْعَلُ الحَاجُّ، غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَطْهُرِي)). البخاري (٢٩٤)، ومسلم (١٢١١).

واتە: کاتێك عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ کەوتە سوڕی مانگانەوە پێی فەرموو ئەوەی حاجی دەیکات بیکە بێجگە لە تەوافی کەعبە نەبێت.

٢. عَنْ جَابر رضي الله عنه: «...فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ تَوَجَّهُوا إِلَى مِنًى، فَأَهَلُّوا بِالْحَجِّ، وَرَكِبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَصَلَّى بِهَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ، ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلًا حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ». مسلم (١٢١٨).

واتە: جابر کوڕی عبدالله رضي الله عنه فەرمووی: کاتێك ڕۆژی تەرویە (٨ ذو الحجة) هات بەرەو مینا بەڕێ کەوتین و تەلبیەی حەجمان کردوونوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا و بەیانیمان کرد لە مینا وە لەدوای نوێژی بەیانی ماوەیەك مایەوە تا خۆر هەڵهات، پاشان بەرەو عەرەفە کەوتە ڕێ.

٣. عَنْ عَبْدَاللهِ بنُ عُمَر رضي الله عنهما قَال: «...صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِنًى رَكْعَتَيْن». البخاري (١٦٥٥).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکانی لە مینا بە دوو ڕکاتی کرد، واتە بە کورت کردنەوە بەبێ کۆکردنەوەیان.

بەڵام بە داخەوە حاجییان هەر لە وادەی چوون بۆ مینایانەوە بەرەو عەرەفە دەکەونە ڕێ و ڕۆژو شەوی (٨ ذو الحجة) بەبێ هیچ سودێکی دینی لە عەرەفە دەمێننەوەو پاداشت و سوننەتێکی گەورەیان لەدەست دەردەچێت و بگرە دەی مرێنن.

**٢. ڕۆژی عەرەفە (٩ ذو الحجة):**

حاجییان دوای خۆر هەڵهاتن لە مینا بە تەلبیەوە (لبيك اللهم لبيك...) بەرەو شاخی عەرەفات دەکەونە ڕێ.

- سوننەت وایە هەتا بانگی نیوەڕۆ لە مزگەوتی (نەمرە) بمێننەوە ئەو بەشەی کە ناکەوێتە سنوری عەرەفاتەوە بمێننەوە گەر گونجا.
- پاش چوونە ناو کاتی نیوەڕۆ بچێتە ناو ئەو بەشەی مزگەوتی (نەمرە) کە چووەتە ناو سنووری عەرەفاتە.
- سوننەتە لە مزگەوتی (نەمرە) ئیمام ووتارێك بدات و پاشان بانگ بدرێت و قامەت بکرێت و نوێژی نیوەڕۆ بە دوو ڕکاتی بکرێت و پاشان قامەت بکرێت نوێژی عەسر بە دوو رکاتی بکرێت و پێش بخرێت.

وە حاجییان سوننەتە بەشداری ئەم ووتارو نوێژە جەماعەتە بکەن.

• پاشان ئەگەر توانیان سوننەتە بچنە بەردەم کێوی عەرەفات ئەو شوێنەی پێی دەڵێن (جبل الرحمة) بووەستن و ڕووەو قیبلە بە زیکرو پاڕانەوە سەرقاڵ بن تاوەکو بانگی مەغریب.

قَالَ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ: «كُنْتُ رَدِيفَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَرَفَاتٍ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ يَدْعُو، فَمَالَتْ بِهِ نَاقَتُهُ، فَسَقَطَ خِطَامُهَا فَتَنَاوَلَ الْخِطَامَ بِإِحْدَى يَدَيْهِ، وَهُوَ رَافِعٌ يَدَهُ الْأُخْرَى». صحيح النسائي (٣٠١١).

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێت: من لەپشت پێغەمبەری خواوە بووم ﷺ بەسەر حوشترەکەیەوە دووعای دەکرد تا ڕەشمەی حوشترەکەی لەدەست کەوت و بە دەستێکی دەیگرت و دەستەکەی تری هەڵبڕیبوو دووعای دەکرد.

باشترین زیکری ئەو ڕۆژە ئەوەیە کە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ و هەموو پێغەمبەران علیهم السلام لە عەرەفەدا کردوویانە : «لا إِلَهَ إِلا اللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَه، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِ شَيْءٍ قَدِيرْ». الترمذي (٣٥٨٥)، الصحيحة (١٥٠٣).

وە هەتا بگونجێت و شوێن ببێت لە شاخی عەرەفە نزیک بەرەوەو کەم تەرخەم مەبە هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوای دوو

حاجی کە دوور دانیشتبوون لە عەرەفەو پێی فەرموون: «فَإِنَّكُمْ عَلَى إِرْثٍ مِنْ إِرْثِ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ». صحيح ابي داود (١٦٨٨)، إبن ماجة (٢٤٣٨).

واتە: بووەستن لەسەر عەرەفە لەسەر پاشماوەیەك لە پاشماوەكانی باوكتان إبراهیم علیه السلام.

وە نابێت ڕۆژی عەرەفە حاجی بەڕۆژوو بێت، عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: «أَنَّ النَّاسَ شَكُّوا فِي صِيَامِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ عَرَفَةَ فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ بِحِلاَبٍ وَهُوَ وَاقِفٌ فِي الْمَوْقِفِ فَشَرِبَ مِنْهُ». البخاري (١٩٨٩)، ومسلم (١١٢٤).

واتە: مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: خەڵكی بەگومان بوون لە بەڕۆژوو بوونی پێغەمبەر ﷺ تا قاپێك شیرم بۆ ناردوو خواردیەوە لە عەرەفات دا.

بەڵكو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری كردووە لە بەڕۆژوو بوونی و دەفەرموێت: «إِنَّ يَوْمَ عَرَفَةَ وَيَوْمَ النَّحْرِ وَأَيَّامَ التَّشْرِيقِ عِيدُنَا أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ». صحيح النسائي (٣٠٠٤).

واتە: ڕۆژی عەرەفە و یەكەم ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕۆژەكانی دوایی جەژنی موسوڵمانانەو ڕۆژی خواردن و خواردنەوەیە.

عَنْ جَابْر ﵁ «حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ، فَرُحِلَتْ لَهُ، فَأَتَى بَطْنَ الْوَادِي، فَخطَبَ النَّاسَ... ثُمَّ أَذَّنَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَتَّى أَتَى الْمَوْقِفَ، فَجعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ الْقَصْوَاءِ إِلَى الصَّخَرَاتِ، وَجَعَلَ حَبْلَ الْمُشَاةِ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَذَهَبَتِ الصُّفْرَةُ قَلِيلًا، حَتَّى غَابَ الْقُرْصُ وقال: وَقَفْتُ هَاهُنَا، وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ». مسلم (١٢١٨).

واتە: جابر ﵁ دەفەرموێت: کاتێك ڕۆژ هەڵهات پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە (قەسوا) حوشترەکەی سوار بوو ڕێکەوتن بەرەو عەرەفە تا گەیشتە (نەمرە)، پاشان ووتارێکی بۆ دان و دوای ئەوە فەرمانی دا بە بیلال بانگی داو قامەتی کردو نوێژی نیوەڕۆی کردو قامەتی کردو نوێژی عەسری کرد (بە دوو رکاتی)، لەنێوانیان دا هیچ نوێژێکی نەکرد، پاشان بەڕێ کەوت و تا گەیشتە بەردەم بەردەکانی شاخی عەرەفە و ڕووی کردە قیبلەو بەردەوام ڕاوەستا هەتا ڕۆژ ئاوا بوو، زەردی خۆر نەماو بازنەی خۆر وون بوو وە فەرمووی: «لێرەدا

وەستام هەموو عەرەفە شوێنی وەستانە»، بەردەوام دەستی هەڵبڕی بوو دووعای دەکرد.

## بەرێزی ڕۆژی عەرەفە

١. عَنْ أَنَس بنُ مَالِك عَنْ الْنَبْي ﷺ قَال: «مَعْشَرَ الْنَاسْ أَتَاني جبْرائِيْل عَلَيْهِ الْسَلام آنِفاً فَأَقْرأَنِي مِنْ رَبِي الْسَلام وَقَالَ إنَ الله عَزَ وَجَلْ غَفَرَ لأَهْل عَرَفَات وَأَهْل المَشْعَر وَضَمن عَنْهُمْ التَبعَات فَقَامَ عُمَر بنُ الخَطَابْ رَضِيَ الله عَنْهُ فَقَالَ يَارَسُولَ الله هَذا لَنَا خاصَة قَال هَذا لَكُمْ وَلِمَنْ أَتَى مِنْ بَعْدِكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيامَة».صحيح الترغيب (١١٥١).

واتە: ئەنەس دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کۆمەڵگای خەڵکی، ئێستا جبریل عليه السلام هات بۆ لام و سەلامی خوای خۆمی پێ گەیاندم و ووتی: خوای پەروەردگار خۆش بووە لەوانەی لە عەرەفاتن وە لە (مشعر الحرام)، (مزدلفة) دان و باقی شوێنانی تری مەراسیمی حەج، عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە بۆ ئێمەیە بە تایبەت؟ فەرمووی بۆ ئێوەو ئەوانەی لەدوای ئێوە دێن تا ڕۆژی دوایی.

٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَ رَسُولَ الله ﷺ قَال: «مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللهُ فِيهِ عَبْدًا مِنَ النَّارِ، مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَإِنَّهُ لَيَدْنُو، ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمِ الْمَلَائِكَةَ، فَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هَؤُلَاءِ؟»مسلم (١٣٤٨). وفي زيادة «إشهدوا ملائكتي أني قد غفرت لهم».صحيح الترغيب (١١٥٤).

واتە: هیچ ڕۆژێك نییە كە خوای پەروەردگار جل جلاله زۆری بەندەكانی ئازاد بكات لە ئاگر بێجگە لە ڕۆژی عەرەفە نەبێت، لە بەندەكانی نزیك دەبێتەوەو بە بەرز ڕایان دەگرێت لای فریشتەكان و دەفەرموێت «ئەمانە چیان دەوێت؟»، وە پاشان دەفەرموێت «فریشتەكانم ئێوە بەشایەت بن ئەوا من لە تاوانیان خۆش بووم».

٣. عَنْ إِبْنُ عُمَرَ ﵄: «...فَإِنَ الله عَزَ وَجَلْ يَنْزِلُ إِلَى سَمَاءِ الدُنْيَا فَيَقُولُ انْظُروا إِلَى عِبَادي شَعْثا غبْراً اشْهِدوا أَني قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ دُنوبَهُمْ وَإِنْ كَانَتْ عَدَدَ قَطْر السَماء وَرَملِ عَالجٍ».صحيح الترغيب (١١٥٤).

واتە: خوای پەروەردگار دێتە ئاسمانی دونیاو دەفەرموێت «سەیری بەندەكانم بكەن بە تەپوتۆزی ڕێگاو هیلاكی هاتوون بۆ لام، بەشایەت بن ئەوا من لە تاوانیان خۆش بووم گەر بە هەندەی دڵۆپەی ئاسمان بێت یا لمی كۆمەڵكراوی بیابان بێت».

**٤. عَن إِبْنُ عَبَاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَن النَبِي ﷺ قال: ((أَخَذَ الله تَبارَكَ وَتَعالَى المِيثَاقَ مِنْ ظَهْرِ آدَمَ بـ(نُعْمَان) - يَعْنِي عَرَفَة - فَأَخْرَجَ مِنْ صَلْبِه كُلُ ذُرِيَة ذَرْأها، فَنَثَرْهُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ كَالْذَرِ، ثُمَ كَلَمَهُمْ قبلاً قَال: (أَلَسْتُ بِرَبِكُمْ قَالوا: بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولوا يَوْمَ الْقِيامَةِ إِنَا كُنَا عَنْ هَذا غَافِلينْ. أَوْ تَقُولوا إِنَمَا أَشْرَك آباؤنَا مِنْ قَبْلُ وَكُنَا ذُرِيَة مِنْ بَعْدِهِمْ أَفَتَهْلكَنا بِمَا فَعَلَ المُبْطِلوْن)).** الصحيحة (١٦٢٣).

واتە: خوای پەروەردگار وادەوپەیمانی لە نەوەی ئادەم وەرگرت لەسەر شاخی عەرەفەهەموو ئادەمیزادێکی کە دێتە دونیا دروستی کرد لەسەر ئەو شاخە خڕی کردنەوەو خوای پەروەردگار قسەی لەگەڵ کردن ڕووبەڕوو فەرمووی: ئەوە من خوای پەروەردگاری ئێوە نیم؟ وتیان بەڵێ شاهێدی دەدەین (کە تۆ بپەرستین و هاوەڵت بۆ دانەنێین)، فەرمووی: ڕۆژی کۆتایی نەڵێن ئێمە بێ ئاگاین لەم پەیمانە یاخود باوو باپیرمان هاوەڵیان بۆ تۆ داناوە و ئێمەش نەوەی دوای ئەوانین و بەبۆنەی کاری ئەوانەوە سزامان دەدەیت.

ئەمە ڕۆژی (قالوا بلی)یە حاجییان دەڕۆنەوە هەمان شوێن ودووپاتی دەکەنەوە کە ئێمە لەسەر وادەو بەڵێنی خۆمانین کە تۆ بپەرستین و هاوەڵت بۆ دانەنێین.

* پاش ئاوابوونی خۆر لە شاخی عەرەفە، حاجییان بەرەو ناوچەی (المزدلفة) دەکەونە ڕێ.

● بە گەیشتنیان بۆناو سنوری (المزدلفة) دەبێت نوێژی مەغریب و عیشا بکەن بە (جمع التأخير) کۆکردنەوەو دواخستنی مەغریب بۆلای عیشا.

سوننەتە بانگێکی بۆ بدەن وە دوو قامەت بکرێت بۆ هەردوو نوێژەکە، مەغریب سێ ڕکات و عیشا دوو ڕکات، وە هیچ نوێژێکی سوننەت لەنێوانیان دا نیە.

● سوننەتە لە مزگەوتی (المشعر الحرام) ئەم نوێژانە ئەنجام بدەن کە دەکەوێتە ناو (المزدلفة) وە، وە هەر لە نزیکی (المشعر الحرام) مزگەوتەکە شەو بکەنەوە ئەگەر گونجا وە ئەگەرنا لەهەر شوێنێکی تردا بێت لەناو سنوری (المزدلفة) دا بێت ئەوە واجبەکەی ئەنجام داوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِ﴾ [البقرة: ١٩٨]. واتە:

گەر عەرەفاتتان جێهێشت یادو زیکری خوای پەروەردگار بکەن لەلای (المشعر الحرام)، وە باشترینی یادکردن نوێژی بەیانی (المزدلفة) یە لە مزگەوتی (المشعر الحرام) دا بکرێت، وە (عند) واتە لای مزگەوتەکە.

عَنْ جَابِر رضي الله عنه «فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَذَهَبَتِ الصُّفْرَةُ قَلِيلًا، حَتَّى غَابَ الْقُرْصُ حَتَّى أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ، فَصَلَّى بِهَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا شَيْئًا». مسلم (١٢١٨).

واتە: جابر رضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام وەستابوو لەسەر عەرەفات هەتا خۆر ئاوابوو زەردی نەماو بازنەی ڕۆژ ون بوو بەتەواوی پاشان ڕێکەوت تاوەکو گەیشتە (المزدلفة) نوێژی مەغریب و عیشای بە بانگێك و دوو قامەت کردو هیچ نوێژی سوننەتی لەنێوانیان دا نەکرد.

● گەر کەسێك دواکەوت لە وەستانی عەرەفات بەڕۆژ ئەوا هەرساتێك لەکۆتا ڕۆژی عەرەفەدا یاخود شەوەکەی ماوەیەك بمێنێتەوە بە نوێژی بەیانی لە (المزدلفة) بگات ئەوا فریای حەج کەوتووەو حەجەکەی قبوڵە.

عَنْ عُرْوَةَ، قَالَ رَسُولَ اللهِ ﷺ: «مَنْ شَهِدَ صَلَاتَنَا هَذِهِ، وَوَقَفَ مَعَنَا حَتَّى نَدْفَعَ وَقَدْ وَقَفَ بِعَرَفَةَ قَبْلَ ذَلِكَ لَيْلًا، أَوْ نَهَارًا، فَقَدْ أَتَمَّ حَجَّهُ، وَقَضَى تَفَثَهُ». أبوداود (١٩٥٠)، والترمذي (٨٩١)، وإبن ماجة (٣٠٨٦).

عوروەی کوڕی مضرس دواکەوتوو بوو دەڵێت گەیشتمە (المزدلفة) پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستا بۆ کردنی نوێژی بەیانی، وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دواکەوتووم لەسەر عەرەفات ماومەتەوە ئایا حەجم بۆ هەیە؟ فەرمووی ئەوەی ئامادەی نوێژی بەیانیمان لە (المزدلفة) بێت و لەگەڵمان بمێنێتەوە تا دەردەچین بۆ مینا بەڵام پێش ئەوە لە عەرەفە مابێتەوە شەوبێت یا ڕۆژ ئەوە حەجەکەی تەواوە.

عبداللّٰه ی کوڕی عومەر خوایان لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: «هەرکەسێك فریای عەرەفات کەوت بە شەو ئەوا فریای حەج کەوتووە، وە ئەوەی فریا نەکەوت بەشەو فریای حەج نەکەوتووە و با ئیحرامەکەی بە عومرە تەواو بکات و ساڵی داهاتوو حەج بکات». أخرجه مالك في الموطأ (٨٨٦)، والدارقطني (٢/٢٤١).

گەر زانی دوای نیوەشەو دەگاتە (المزدلفة) پێویستە لە ڕێگادا نوێژی مەغریب و عیشا بکات لەبەر ئەوەی نوێژی عیشا کۆتا کاتی نیوە شەوە، نابێت تێپەڕ ببێت بۆ دەرەوەی کاتی خۆی.

**عنْ جابِر رضي الله عنه قَال: قَالَ رَسول الله ﷺ: «وَقِفْتُ هُنَا والمُزْدَلِفَة كُلُهَا مَوْقِفْ...». مسلم (١٢١٨).**

**واتە: جابر دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی لە (المزدلفة): لێرەدا وەستام (واتە مزگەوتی المشعر الحرام) وە هەموو سنوری (المزدلفة) شوێنی وەستانە.**

- **پاش نوێژی مەغریب و عیشا سوننەتە بخەویت تا بەیانی، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاکشاوە تا بەیانی واتە هیچ جۆرە نوێژێکی سوننەتی نەکردووە بۆئەوەی بەباشی بتوانێت کارەکانی حەج ئەنجام بدات، لە ڕیوایەتی جابر رضي الله عنه «ثُمَّ اضْطَجَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ». مسلم (١٢١٨).**

- **سوننەتە نوێژی بەیانی لە (المزدلفة) لە سەرەتای کاتەکەیدا بکرێت دوانەخرێت، لە ڕیوایەتی جابر رضي الله عنه «وَصَلَّى الْفَجْرَ، حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ، بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ». مسلم (١٢١٨).**

**واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی کردووە لە سەرەتای کاتی نوێژی بەیانی بە بانگ دان و قامەت کردنێك.**

وَعَنْ إِبْنُ مَسْعُودٍ ﵁ قال: «مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى صَلاَةً بِغَيْرِ مِيقَاتِهَا، إِلَّا صَلاَتَيْنِ: جَمَعَ بَيْنَ المَغْرِبِ وَالعِشَاءِ، وَصَلَّى الفَجْرَ قَبْلَ مِيقَاتِهَا». البخاري (١٦٨٢)، ومسلم (٣١٠٤).

واتە: عبدالله ی كوڕی مسعود دەڵێت: نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژێك لە كاتە ئاساییەكانی خۆی دا نەكات "واتە پاش چوونە ناو كاتەكەیەوە" بێجگە لە مەغریب و عیشا لە (المزدلفة) "واتە ئەوەندە دوای خست" وە نوێژی بەیانی لەسەرەتای كاتەكەیدا.

وە لە ڕیوایەتی بوخاری دا (١٦٨٣) خەڵك دەیووت بەیانی بووە وە هەندێك دەیووت بەیانی نەبووە، ئەوەندە زوو دەیان كرد.

• پاش نوێژی بەیانی (المزدلفة) پێغەمبەری خوا ﷺ چووەتە سەر تەپۆڵكەی (قزح) یاخود (المشعر الحرام) كە ئێستە مزگەوتەكەی لەسەر كراوەتەوە ڕووەو قیبلە وەستاوەو (الله أكبر والحمد لله ولا إله إلا الله) وە دووعاو نزایەكی زۆری كردووە تاوەكو دونیا كەمێك ڕوون بوەتەوە بە شێوەیەك كە خەڵكی ڕێگاو یەكتری ببینن.

پاشان بەڕێ کەوتوون بەرەو مینا پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵبێت، بە پێچەوانەی پێش ئیسلام کە دەمانەوە تاوەکو ڕۆژ هەڵدەهات پاشان (المزدلفة) یان بەجێ دەهێشت.

گەر ڕێکەتن و لە ڕێگادا ڕۆژیان بەسەردا هەڵهات ئەوە ئاساییە وە هەروا دەبێت و دەگونجێت.

ڕیوایەتەکەی جابر ﷺ: ((فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَدَعَاهُ وَكَبَّرَهُ وَهَلَّلَهُ وَوَحَّدَهُ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى أَسْفَرَ جِدًّا)). مسلم (١٢١٨).

واتە: جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی دەکردە قیبلەو دووعاو (اللهُ أَكْبَر وَالحَمْدُ لله وَلا إِلَهَ إِلا الله) ی دەکرد بەردەوام وەستابوو تا بەتەواوی دوونیا ڕوون بووەوە پێش خۆر هەڵهاتن.

وە دەبێت هەر بەردەوام بێت لە (تلبية) کردن بەگوێرەی توانای بە شەوو ڕۆژ تا دەگاتە (جمرات).

- **پلەو پاداشتی مانەوەی (المزدلفة):**

عَنْ أَنَسِ بنُ مَالِكِ ﷺ قَال: قَالَ رَسُول الله ﷺ: ((إِنَ الله عَزَ وَجَلْ غَفَرَ لأَهْل عَرَفَات وَأَهْل المَشْعَر)). صحيح الترغيب (١١٥١).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: خوای پەروەردگار خۆش بووە لەوانەی لە عەرەفات و "المشعر الحرام" (المزدلفة)ن.

● مانەوەی شەوی (المزدلفة) تا دوای نوێژی بەیانی ڕای کۆی زانایان لەسەر ئەوەیە واجبە بە نەمانەوەی تێیدا بەبێ هۆکار بە (فدیة) پڕ دەبێتەوە، کە سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بوونە یاخود خواردنی شەش هەژار یاخود سەربڕینی مەڕێکە ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ [البقرة: ١٩٦]. وە ڕیوایەتی کعب بن عمرە: ((صَوْمُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، أَوْ إِطْعَامُ سِتَّةِ مَسَاكِينَ...أَو ذَبحَ شاةٍ...)).البخاري (١٨١٦)، ومسلم (١٢٠١).

● ڕێگە دراوە بە نەخۆش و پەککەوتەو نەتوانەکان لە منالّ و ئافرەتان کە لە نیوەشەو بەدواوە (المزدلفة) بەجێ بهێڵن و بەرەو مینا بکەونە ڕێ، بەلاّم کەسانی بێ عوزر کە دەتوانن بمێننەوە واجبە بمێننەوە لە (المزدلفة) تا دوای نوێژی بەیانی، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی بەس بە کەسانی خاوەن عوزری داوە بە ڕۆیشتن.

عَنْ إِبْنُ عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: ((أنَ رَسولَ الله صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمْ أَذَنَ لِضِعْفَة النَاس مِن الْمُزْدَلِفَة يليل)).أحمد (٣٣/٢).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی دا بە لاوازەکانی خەڵکی کە لە (المزدلفة) بە شەو دەرچن.

عَنْ إِبْنُ عَبَاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَال: «أَنا مِمَنْ قَدمَ الْنَبِي صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمْ لَيْلَة الْمُزْدَلِفَة فِي ضعْفَة أَهْله». البخاري (١٦٧٨)، ومسلم (١٢٩٣).

واتە: عبدالله ی کوڕی عباس دەڵێت: من یەکێك بووم لەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کەسە لاوازو نەتوانەکانی خۆی دا منی نارد بۆ (مینا)، وە لە ڕیوایەتێکی مسلم دا هاتووە ژمارە (٣١٣): «بعث بي رسول الله صلى الله عليه وسلم بسحرٍ من جمع في ثقل نيي الله صلى الله عليه وسلم...» واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە پارشێودا منی لەگەڵ کەس و کاری دا ناردووە.

وە ئەسمای کچی أبوبکر ﷺ دەیفەرموو بە عبدالله ی کوڕی: «هَلْ غَابَ القَمَرُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَتْ: فَارْتَحِلُوا...و قالت: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَذِنَ لِلظُّعُنِ». البخاري (١٦٧٩)، ومسلم (٣١١٠).

واتە: ئایا مانگ ون بوو؟ گەر وون بوایە دەمان ووت بەڵێ و دەیووت با بڕۆین و (المزدلفة) مان بەجێ دەهێشت و پاشان ووتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی بە کەسانی نەتوانا داوە.

کەواتە دەبێت نزیکی پارشێو باش وایە (المزدلفة) بەجێ بهێڵن، لەبەر ئەوە شەوی جەژن مانگ درەنگ ئاوا دەبێت.

● وە ئایا دەتوانن ئەوانەی بەشەو گونجا بچنە مزگەوتی (المشعر الحرام) ئەو سوننەتە بکەن کە ڕوو بکەنە قسبلەو زیکرو پاڕانەوە بکەن ماوەیەك.

عَنْ سَالِمٌ: «وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُقَدِّمُ ضَعَفَةَ أَهْلِهِ، فَيَقِفُونَ عِنْدَ المَشْعَرِ الحَرَامِ بِالْمُزْدَلِفَةِ بِلَيْلٍ فَيَذْكُرُونَ اللَّهَ مَا بَدَا لَهُمْ، ثُمَّ يَرْجِعُون». البخاري (١٦٧٦)، ومسلم (٣١١٧).

واتە: سالم دەڵێت: عبدالله ی کوڕی عمر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: کەس و کاری لاوازو نەتوانەکانی دەنارد بەشەو لە (المشعر الحرام) بوەستن و زیکرو دوعا بکەن پاشان دەرچن لە (المزدلفة).

وە بەردەوام حاجییان دەبێت دەم بە (تلبية)بن.

### ٣. ڕۆژی قوربانی (١٠ ذو الحجة) یوم النحر:

**سیٚ یەم ڕۆژی حەج یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە.**

- **پلەو پایەی ئەم ڕۆژە:**

**خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ﴾ [التوبة: **٣**]. **إبن کثیر دەفەرموێت: (یوم الحج الأكبر اليوم النحر)**.تفسير إبن كثير ج١ ص١١.

**ڕۆژی حەجی گەورە (الحج الأكبر) یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە.**

**عَنْ اِبْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَ رَسُولَ الله ﷺ: «وَقَفَ يَوْمَ النَّحْرِ بَيْنَ الْجَمَرَاتِ فِي الْحَجَّةِ الَّتِي حَجَّ، فَقَالَ: «أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟» قَالُوا: يَوْمُ النَّحْرِ، قَالَ: "هَذَا يَوْمُ الْحَجِّ الْأَكْبَرِ"».** أبوداود (١٩٤٥).

**واتە: عبدالله ی کوڕی عمر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێوان (جەمرات) دا وەستاو فەرمووی ئەمە چ ڕۆژێکە؟ وتیان: یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە (یوم النحر)، فەرمووی: ئەمە ڕۆژی حەجی گەورەیە (الحج الأكبر).**

وَعَنْ عَلي بْنُ أَبي طَالب رضي الله عنه قَال: «سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ يَوْمِ الحَجِّ الأَكْبَرِ، فَقَالَ: "يَوْمُ النَّحْرِ"».صحيح أبي داود (١٧٧٠٠)، صحيح الترمذي (٩٥٧).

واتە: عەلی کوڕی أبي طالب دەفەرموێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی حەجی گەورە (الحج الأكبر) کامەیە؟ فەرمووی: ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانە.

وە هەروەها لە ڕیوایەتێکی ئەبو هورەیرەدا هەمان شێوە دەگێڕێتەوە لەلای ئیمام مسلم (١٣٤٧)، وأبوداود (١٩٤٦).

کەواتە ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە کە دەڵێن (الحج الأكبر) ئەو حەجەیە کە عەرەفە بکەوێتە ڕۆژی هەینییەوە، لەبەر ئەوەی حەجەکەی پێغەمبەر ﷺ کەوتە هەینییەوە.

بەڵکو هەموو ساڵێك یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان پێی دەوترێت (الحج الأكبر) لەبەر ئەوە زۆری کارەکانی حەج دەکەوێتە ئەو ڕۆژەوە.

- حاجییان لەم ڕۆژەدا پێویستە ئەم کارانە بەم شێوازانەی خوارەوە ئەنجام بدەن:

١. (رمي جمرة العقبة) ڕەجم کردنی (جمرة) ی گەورە.

٢. سەربڕینی ئاژەڵ.

٣. سەر تاشین یاخود کورت کردنەوە.

٤. تەوافی (الإفاضة) ماڵی خواو سەعی سەفاو مەروە.

## ١. ڕەجم کردنی (جمرة العقبة) جەمرەی گەورە:

حاجی بە (تلبیة)وە بەرەو مینا دەکەوێتە ڕێ و لە سنوری (مینا) یاخود گەر گونجا نزیك (جمرات) حەوت بەرد کۆ بکاتەوە بۆ ڕەجم کردنی (جمرة العقبة).

**عَنْ إِبْنُ عَبَاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَال: «قَالَ لي رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَدَاة العَقَبَة وَهُوَ واقِفُ عَلَى راحِلَتِهِ: هَات القَطْ لي، فَلَقَطْتُ لَهُ حَصِيات...».** صحيح إبن ماجة (٢٤٥٥)، الصحيحة (١٢٨٣).

عبدالله ی کوڕی عباس دەڵێت: بەیانی (یەکەم ڕۆژی قوربان) لەبەردەم (جمرات) دا پێغەمبەر ﷺ بەسەر حوشترەکەیەوە وەستابووفەرمووی: چەند بەردێکم بۆ کۆبکەرەوە بۆ ڕەجم کردنی (جمرة العقبة).

- یەکەم کاری حاجی لە مینا ڕەجم کردنی (جمرة العقبة)یە وە بەگەیشتنت بەردەم (جمرة العقبة) پێش ڕەجم کردن کۆتایی بە (تلبیة) دێت:

عَنْ الفضل ﵁: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى بَلَغَ الْجَمْرَةَ» أو «حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ». مسلم (٢٦٨،٢٦٧).

واتە: فةضلی کوڕی عباس ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ دەڵێت لەپشت پێغەمبەری خوا ﷺ بە سواری ڕۆشتین بەردەوام (تلبية) ی دەکرد تا گەیشتە (جمرة العقبة).

● سوننەتە گەر گونجا بەم شێوەیە ڕەجمی (جمرة العقبة) بکرێت: (مەکە) بخاتە دەستی چەپی و (مینا) دەستی ڕاستی.

عَنْ إِبْنُ مَسْعود ﵁: «...جَعَلَ البَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ وَمِنًى عَنْ يَمِينِهِ، وَرَمَى بِسَبْعٍ وَقَالَ: "هَكَذَا رَمَى الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ البَقَرَةِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"». البخاري (١٧٤٨).

عبدالله ی کوڕی مسعود ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ مەکەی خستوتە دەستی چەپی و مینا ی خستوتە دەستی ڕاستی و بە حەوت بەرد ڕەجمی (جمرة العقبة) ی کردووە، بەم شێوەیە ڕەجمی عەقبەی کردووە ئەوەی کە سورەتی بەقەرەی بۆ هاتوەتە خوارەوە (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ).

وە پێویستە حەوت بەرد زیاترو کەمتر بەکار نەهێنرێت و لەگەڵ هەموو بەردێك دا (الله أکبر) بکات.

عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه: «...فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا...». مسلم (١٢١٨).

و عَبْدالله بنُ مَسْعُود رضي الله عنه: «...يَرْمِي الجَمْرَة... بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ». البخاري (١٧٥٠)، ومسلم (١٢٩٦).

جابر و عبدالله ی کوڕی مسعود خوایان لێ ڕازی بێت دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ بە حەوت بەرد (جمرة العقبة) ی ڕەجم کردووە لەگەڵ هەموو بەردێك دا (الله أکبر) ی کردووە.

- پێویستە بەردەکان بە هەندەی نۆکێك بن یاخود شتێك گەورەتر.

قَالَ رَسُولَ الله ﷺ: «وَإِذَا رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ فَارْمُوا بِمِثْلِ حَصَى الْحَذْفِ». صحيح أبي داود (١٧٢٩)، و رواية إبن عباس «عليكم بحصى الحذف». مسلم (٣٠٧٨).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: گەر (جمرة العقبة)تان ڕەجم کرد ڕەجمی بکەن بە هەندەی بەردی (الحذف) واتە (بەردێك کە دەخرێتە نێوان هەردوو پەنجەی شایەتمان و هەڵدەدرێت).

وە إبن تيمية وإبن عثيمين خوايان لێ ڕازی بێت دەڵێن: (فوق الحمص دون البندق) بەردەکە لە نێوان نۆك و بندوق دا بێت.

● بەردەکان واجبە بکەوێتە حەوزەکەو مەرج نییە بیدات لە پایەکە.

ئیمامی نەوەوی لە (شرح المسلم) دا ج[٩] ص[٥٠] دەفەرموێت: (وأجمعوا على أن الرمي يجزيه على أي حال رماه إذا وقع في المرمى)، وقال العثيمين في الشرح الممتع ج[٣] ص[٣٤٨]: (المقصود أن تقع في الحوض سواءً ضربت العمود أم لم تضربه).

واتە: ڕای کۆی زانایان لەسەر ئەوەیە ڕەجم کردنەکە دروستە بەهەر شێوەیەك بێت بە مەرجێك بکەوێتە حەوزەکەوە.

● وە نابێت حەوت بەردەکە بە یەك جار هەڵبدرێت بەڵکو بە حەوت جار بێت، وە ئەگەر هەڵی دا ئەوا هەرچەندێك بێت ئەوا بە یەك جار دادەنرێت وەکو ئیمامی نەوەوی لە (شرح المسلم) دا ج[٨] ص[٤١٨] دەفەرموێت ڕای کۆی زانایانی لەسەرە.

● وە دروستە بە بەردێك ڕەجم بکەی کە ڕەجمی پێ کرابێت، هیچ ڕێگرییەك نیە لەسەری نە لە قورئان دا و نە لە سوننەت دا، کە ئەمە ئەمڕۆ بەر دەستی کەس ناکەوێت لەبەر ئەوەی حەوزەکە قوڵە و هەموو

دەچێتە ناو حاویەکەی لە خوارەوە بەدەر لەو بەردانەی کە لە چواردەوری حەوزی جەمرەدا کەوتوون ئەوانە هەر ڕەجمیان پێ نەکراوە و بە زیادە هەڵگیراون و لەوێدا فڕێ دراوە ئەوانە هیچ کێشەیەك نییە لە بەکارهێنانی دا.

ئەمە ڕای کۆی زانایانە بڕوانە:

١. المحلى لإبن حزم ج٥ ص١١٩.
٢. الأضواء للشنفيطي ج٥ ص٢٠٣.
٣. الشرح الممتع للعثيمين ج٣ ص٣٤٩.
٤. حجة النبي للألباني ص٨٢.

- **پاداشتی ڕەجم (جمرات):**

**عَنْ إِبْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عن النبي ﷺ قال: «وإذا رمى الجمار لا يدرى أحد ماله حتى يوفاه يوم القيامة».** صحيح الترغيب (١١٥٥)، **وفي أخرى «وأما رميك الجمار فلك بكل حصاة رميتها تكفير كبيرة من الموبقات».** صحيح الترغيب ج٣ ص٣٧، **وإبن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ النَبِي ﷺ: «إِذا رَمَيْت الجِمار كَانَ لَكَ نوراً يَوْمَ القيامَة».** الصحيحة (٢٥١٥).

واتە: فەرموودەی یەکەم، گەر ڕەجمی جەمرەی کرد کەس نازانێت چ پاداشتێکی پێ دەبەخشرێت ڕۆژی دوایی، وە لە ڕیوایەتێکی تردا: بە

هەموو بەردێکی ڕەجم کردن تاوانێکی گەورە دەسڕێتەوە، وە لە ڕیوایەتەکەی تردا: ڕەجم کردنی جەمەرات دەبێتە نوور بۆ ڕۆژی دوایی.

● عبدالله ی کوڕی عباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت «کاتێك إبراهیم علیه السلام شەیتان ڕێی پێ گرت لەلای (جمرة العقبة) دا حەوت بەردی تێگرت تا ڕۆچوو لە زەوی دا پاشان لە (جمرة)ی دووەم دا ڕێی پێ گرت و حەوت بەردی تێگرت تا ڕۆچوو بە زەوی دا پاشان لە (جمرة)ی سێ یەم دا ڕێی پێ گرت و حەوت بەردی تێگرت تا ڕۆچوو بە زەوی»دا، پاشان عبدالله ی کوڕی عباس فەرمووی «الشَیْطَان تَرْجمونَ وَمِلَةِ أَبِيكُمْ إِبْرَاهيم تَتبعون». صحيح الترغيب (١١٥٦).

واتە: شەیتان ڕەجم دەکەن و شوێنکەوتەی باوکتان (إبراهیم علیه السلام) دەکەون.

● خوای پەروەردگار ﷻ فەرمووی بە شەیتان ﴿فَإِنَّكَ رَجِيمٌ﴾ واتە تۆ ڕەجم کراویت، وە ڕەجم کردنی دەرکردن بووە لە بەهەشت و بەزەیی پەروەردگار.

● وە پێغەمبەران علیهم الصلاة السلام وەکو (إبراهیم، محمد...) ڕەجمیان کردووە.

● وە (ملائکة) فریشتەکان ڕەجمیان دەکەن بە ئەستێرەکان لە ئاسمان دا: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ﴾ [الملك: ٥]، وە موسوڵمانانیش لە حەج دا ڕەجمی دەکەن، کەواتە موسوڵمان کاری خواو پێغەمبەران و فریشتەکان ئەنجام دەدەن.

● **کاتی ڕەجم کردنی (جمرة العقبة):**

بۆ کەسانی بەتواناو بەهێز لەدوای هەڵهاتنی ڕۆژ تا شەو بەرەبەیانی ڕۆژی دووەمی جەژن.

عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَال: «رَمَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الجَمْرَة يَوْمَ النَحْرِ ضُحَى...». مسلم (١٢٩٩).

واتە: جابر دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی (جمرة العقبة) ی کرد ڕۆژی جەژن کاتی چێشتەنگاو.

عَنْ إِبْنُ عَبَاس رضي الله عنهما : «كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسْأَلُ يَوْمَ النَّحْرِ بِمِنًى، فَيَقُولُ: «لاَ حَرَجَ» فَسَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ،

قَالَ: «اذْبَحْ وَلاَ حَرَجَ» وَقَالَ: رَمَيْتُ بَعْدَ مَا أَمْسَيْتُ، فَقَالَ: "لاَ حَرَجَ" )).البخاري (١٧٣٥)، ومسلم (١٣٠٦).

واتە: عبداللە ی کوڕی عباس دەفەرموێت: لـە مینا دا ڕۆژی جەژن پێغەمبەری خوا ﷺ هەر پرسیارێکی لێ دەکرا دەیفەرموو: دروستە ڕێگری نییە، پیاوێك پرسیاری لـێکرد: سەرم تاشی پێش قوربانی کردن، فەرمووی: سەری بڕە دروستە، وە وتی: ڕەجمی (جمرة العقبة) م کرد لـەدوای ئێوارە (شەو) فەرمووی: دروستە ڕێگری نییە.

کەسانی ڕێگە پێدراو لـە نەخۆشی و پەك کەوتەو بێ توانا سێ کاتیان بۆ هەیە:

١. کۆتایی شەوی جەژن پێش بانگی بەیانی.

عَنْ عَبْدالله مَوْلَى أَسْماءَ بِنْتُ أَبِي بَكْرَ رضي الله عنهما: «...فَصَلَّتْ سَاعَةً ثُمَّ قَالَتْ: «يَا بُنَيَّ، هَلْ غَابَ القَمَرُ؟»، قُلْتُ: لاَ، فَصَلَّتْ سَاعَةً ثُمَّ قَالَتْ: «يَا بُنَيَّ هَلْ غَابَ القَمَرُ؟»، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَتْ: «فَارْتَحِلُوا»، فَارْتَحَلْنَا وَمَضَيْنَا، حَتَّى رَمَتِ الجَمْرَةَ، ثُمَّ رَجَعَتْ فَصَلَّتِ الصُّبْحَ فِي مَنْزِلِهَا، فَقُلْتُ لَهَا: يَا هَنْتَاهُ مَا أُرَانَا إِلَّا قَدْ غَلَّسْنَا، قَالَتْ: "يَا بُنَيَّ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَذِنَ لِلظُّعُنِ" )).البخاري (١٦٧٩)، ومسلم (١٢٩١).

واتە: عبداللە دەگێڕێتەوە لە ئەسمائی کچی ئەبوبکری صدیق ڕەزای خوایان لێبێت لە موزدەلیفە ماوەیەك نوێژی کردو پاش ئاوابوونی مانگ ووتی: بەرێکەون بۆ مینا، بەرێکەوتین تا ڕەجمی (جمرة العقبة) ی کردو پاشان گەڕایەوەو نوێژی بەیانی لە مینا کرد، پاشان ووتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی داوە بە ئافرەت و پەککەوتان.

بە ڕووکەش ئەم فەرموودەیە هەندێك لە زانایان ڕێگەیان داوە بە ڕەجم کردنی (عەقەبە) نیوەی کۆتایی بەشی شەوی جەژن.

**٢.** زۆری زانایان ڕێگەیان داوە بە ڕەجم کردنی (عەقەبە) دوای بانگی بەیانی نەك پێش بانگ بەڵکو پێش بانگ بۆئەوەی بگەنە (مینا) بەڵام دەبێت ڕەجم کردن بخەنە دوای بانگ.

عَنْ إِبْنُ عَبَاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُول: «أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ، فَصَلَّيْنَا الصُّبْحَ بِمِنًى، وَرَمَيْنَا الْجَمْرَةَ». صحيح النسائي (٣٠٤٨).

واتە: عبداللە ی کوڕی عباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کەسە نەتوان و لاوازەکانی دا ناردمی و نوێژی بەیانیمان لە (مینا) کردو ڕەجمی (جمرة العقبة)مان کرد.

عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: «وَدِدْتُ أَنِّي اسْتَأْذَنْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَمَا اسْتَأْذَنَتْهُ سَوْدَةُ، فَصَلَّيْتُ الْفَجْرَ بِمِنًى قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَ النَّاسُ، وَكَانَتْ سَوْدَةُ امْرَأَةً ثَقِيلَةً ثَبِطَةً، فَاسْتَأْذَنَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَذِنَ لَهَا، فَصَلَّتِ الْفَجْرَ بِمِنًى، وَرَمَتْ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَ النَّاسُ». صحيح سنن النسائي (٣٠٤٩).

واتە: عائشە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: حەزم دەکرد ئیزن لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرم وەکو (سەودە) ی خێزانی ئیزنی وەرگرت، نوێژی بەیانیم لە (مینا) بکردایە پێش ئەوەی خەڵکی بگەن.

سەودە ئیزنی وەرگرت لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیزنی داو نوێژی بەیانی لە (مینا) کردو ڕەجمی (جمرة العقبة)ی کرد پێش ئەوەی خەڵکی بگەنە (مینا).

**٣.** هەندێك لە زانایان دەڵێن ڕێگە دراوە نەخۆش و پەککەوتەکان لە نیوەشەو بەدواوە (مزدلفة) جێ بهێڵن و بەرەو (مینا) بکەونە ڕێ بۆ ئەوەی بەر قەرەباڵغی ڕێگا نەکەون بەڵام دەبێت ڕەجم کردنی (العقبة) بخەنە دوای ڕۆژ هەڵهاتن، وە ئەو ڕیوایەتانەی پێش و بێ ئاگاداری و ئیزنی پێغەمبەر ﷺ بووە.

